# مشکە


خاوەنی ئیمتیاز

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

سەرنووسیار

**ئەمیر حاجی داود**

راوێژکار

**رێواس ئەحمەد**

بەڕێوەبەری نووسیاری

**ڕەهێڵ ڕەشید**

سەرپەرشتیاری هونەری و نەخشەسازی

**گەیلان عەبدوڵلا**

٤٦٧٥٦٠٧

وێنەکێش

**شێروان موحسین**

دەستەی نووسیاری

**هەوار شەریف**

**داستان کاکە ساڵح**

**شنە سەدیق**

**زارا ئەحمەد**

هەڵەگری

**شێرزاد فەقێ ئیسماعیل**

ژمارە ٤٠ تەمووز ٢٠٠٩


**لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی**




**دەردەچێت**

## مشکە بۆ تەمەنی ٩ تا ١٤ ساڵانە



باسەرە

کۆوار

زاری کرمانجی

نووشفاق

مناڵانی باوەگوڕگوڕ

هەرمان


دەتوانن بابەتەکانتان بەم ناونیشانە بۆ ئێمە ڕەوانە بکەن

هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس ـ شەقامی گوڵان

لەرێی (بۆتان جەوهەر)ەوە بابەتەکانتان ڕەوانە بکەن.

سەنتەری لاوانی میدیا بۆ ڕۆشنبیری و هونەر و ڕاگەیاندن ـ گەڕەکی کوران

کەرکووك ـ دەزگای ڕۆشنبیری شەفەق

سۆران ـ دەزگای زاری کرمانجی بۆ ڕۆشنبیری و هونەر و ڕاگەیاندن

یان لەرێگای پۆستی ئەلیکترۆنی

E.mail: mshka _ mag@yahoo.com

E.mail: gaylanart@yahoo.com

GNOMES & TROLLS

# دارستانی کورتەباڵاکان و ژووری نهێنییەکە

**وەرگێڕانی: نیڤار**

لە شوێنێکی دوور لە باکووری جیهاندا، دارستانێکی سەرسوڕهێنەر هەبوو کە بەدرێژای وەرزی زستان گشت شوێنێکی دارستانەکە بە بەفری سپی داپۆشرابوو. لەم دارستانەدا تەنیا کورتەباڵاکان دەژیان.

لە دارستانەکەدا چەند غولێکی سپی قەڵەوی کورتەباڵا دەژیان.



ئەم غولە کورتەبالآیانە لە ئەشکەوتێکدا دەژیان باوکێکی پیریان هەبوو کە ناوی (فاشا) بوو هەردەم برسی بوو و داوا لە کورەکانی (لیف) و (دیف) دەکرد خواردنی بۆ ئامادە بکەن ئەگینا لە برسا دەمرێت.

لە لایەکی تری دارستانەکەدا، کورتەبالآیەکی پیر هەبوو ناوی (جیلی) بوو لەگـــەڵ خێزانەکـەی (تانیا) و کورە بچووکەکەی (جۆنیور) دەژیان.

جیلی کورتەباڵا سەرەڕای ئەوەی سەر و ریشی سپی و پیربوو، بەڵام حەزی لە کارکردن بوو و ئامۆژگـاری کورەکەی دەکرد کەوا کاربکات.

هەندێ جاریش چەند دەنکێك لە تۆوە سحرییەکەی دەدایە کورەکــەی بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە ناو ژووره سەرسوڕهێنەرەکە، تا نهێنییەکانی ناو ئەو ژوورە بدۆزێتەوە.

(جۆنیور)ی کورتەباڵا هەر جارەی ئەم تۆوە سحرییانەی بخواردبایە دەیتوانی بچێتە ناو ژووره نهێنیەکــە و چەند نهێنیەك بدۆزێتەوە.

رۆژێکیان (جۆنیور) گرنگترین نهێنی ناو ژوورەکــەی دۆزییەوە، ئەویش فەردەیەك تۆو بوو کـــە باوکی پێیگوتبوو ئەم تۆوانە سەرچاوەی کشتوکـــاڵی دارستانەکەن و ئەگەر غولە برسییەکـــان بیدۆزنەوە ئەوە دەخۆن و ئەوا هیچ نامێنێت تا لەو دارستانە بیڕوێنین.



(جیلی) بە کورەکەی گوت ئەمە نهێنی ئەم ژوورەیە و پێویستە پارێزگاری لێ بکەیت و نەهێلیت غولەکان بیخۆن.

(جۆنیور)ی بچووك لە دارستانەکەدا بەدوای دۆزینەوەی رێگـەیەکـدا دەگەڕا بۆ زیادکـــردنی تۆوەکــە و پاراستنی لە دەست غولەکان.







له ڕێگەدا تووشی تەیرێکـــی دەنووك سووری پەروباڵ ڕەش بوو کـــە ئەویش (کوری) قەلەڕەش بوو و سڵاوی لە (جۆنیور)ی بچووك کرد و پێی گوت: ئاگاداربە! لەم هێلکانە نزیك مەبەوە چونکە قەلەڕەشی بچووکی تێدایە و پاش ماوەیەکی تر دێنەدەرەوە.

(جۆنیور)ی بچووك بەپێکەنینەوە گوتی: من مرۆڤم هێلکەی قەلەڕەشەکـــان ناخۆم، ئەوە غولەکـــان وادەکەن.

بۆیە (جۆنیور)ی بچووك و (کوری) قەلەڕەش بڕیاریاندا بەیەکەوە پارێزگاری لە هێلکەکـــان و تۆوی ناو ژووورە نهێنییەکە بکەن.

(جۆنیور)ی بچووك و (کـوری) قەلەڕەش بەرەو ژووورە نهێنییەکە بەڕێکەوتن و لـەڕێگەدا تووشی غولـە کورتەباڵاکە بوون.

غولە کـورتەباڵاکـــە بە (جۆنیور)ی بچووکـــی گـــوت کەوا دایك و باوکـــی لە مەترسیدان و غولە کورتەباڵاکانیش برسییانە، بۆیە دەبێت (جۆنیور) فەردە تۆوەکە بدات بە غولە برسییەکان.

(جۆنیور) و (کوری) بەپەلە بەرەو ماڵەوە بەڕێکـەوتن و بینیان ئەو ئەشکەوتەی (جیلی)ی باوکـــی و (تانیا)ی دایکی تیایدا دەژین دارماوە و پارچە دارێکی گەورە کەوتووەتە سەر سنگی باوکی. (جۆنیور)ی بچووك ئازایانە دارەکـەی لەسـەر سنگی باوکی لادا و باوکـی دڵی خۆشبوو کـە بینی کوڕەکـەی توانای ئەوەی هەیە پارێزگاری لەخۆی بکاتز (جۆنیور) لە باوکی پرسی ئەی کوا دایکم؟



باوکیشی گوتی: غولە برسییەکـــان دەستبەسەریانکـــردووە، پێویستە بچیت رزگاری بکەیت.

(جـۆنیور)ی بچووك بەپەلـــە بەرەو ئەشکـــەوتی غولـــە کـــورتەباڵاکـــان بەڕێکەوت، بەڵام نەیدەزانی غولەکان بۆ دایکیان دەستبەسەر کردووە.







ئەم غولە برسیانە نەیاندەویست کار بکەن، بەڵکو تەنیا دەیانویست بخۆن.
(تانیا)ی دایکی (جۆنیور) دەیزانی چێشتی خۆش خۆش ئامادەبکات بۆیە غولەکان رفاندیان و لەناو ئەشکەوتەکەی خۆیان بەندیان کرد و خواردنیان پێی ئامادەدەکرد و دواتر دووبارە لەناو بەندیخانەیەکی داربەندبان دەکردەوە.
لەکاتێکدا جۆنیور و قەلەڕەشی هاوڕێی گەیشتنە ئەشکەوتی غولەکان رووبەڕووی یەکتر بوونەوە و بەڵام هێزی جۆنیوری بچووك لە دەستەکانی نەبوو، بەڵکو لە بەکارهێنانی مێشکی بوو.
بۆیە غولە برسییەکان نەیان توانی بیوەستێنن و توانی دەرگای ئەو بەندیخانەیەی کە دایکی تیایدا بەندکرابوو بشکێنێت و ئازادی بکات.
جۆنیور توانی وا بکات غولە پیرەکە (فاشا) بهێنێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکەی کە تا ئەو کاتە نەهاتبووە دەرەوە، گوایە لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی بەرگەی ساردی بەفری دارستانەکە بگرێت.
تانیای دایکی جۆنیوریش توانی هەردوو کوڕەکەی فاشای کورتەباڵا بەپەتێك ببەستێتەوە.
دوای چەند رۆژێك وەرزی زستان تەواو بوو و جیلی کورتەباڵا بەیارمەتی جۆنیوری کوڕی دووبارە دەستیان بەکار کردن کردەوە و خواردنیان بەیەکسانی بەسەر دانیشتوانی دارستانەکە دابەشدەکرد. غولە کورتەباڵا برسییەکانیش ناچاربوون بێنە پاڵ جیلی و جۆنیوری کوڕی و کار بکەن بۆ ئەوەی خواردن بەدەستبهێنن.
ئەوە هەمووی بەسەرهاتی ئەو فیلمە کارتۆنییەی منداڵانە، ناوی فیلمەکە (نهێنی ژوورەکە) لە دەرهێنانی رۆبرت روودینە و سیناریۆیی سیلفاتۆر کاردۆنییە.



# بپرسە و مەترسە

مشکە بۆ وەڵامەکانتان دەگەڕێ

**ئامادەکردنی: هەوار شەریف**




# فیلم کارتۆنی "دێوەکان"

ئێوەی منداڵان دێوتان بینیوەو دەزانن دێو چۆنە؟ نەخێر دێوە ترسناکەکان تەنها لە چیرۆکی منداڵان و فیلم کارتۆنەکاندا هەیە. فیلمی ئەم جارە دەربارەی دێوە فیلم کارتۆنییەکانە، لەم فیلمە کارتۆنیە خۆشەدا دێوەکان کاریان ئەوەیە لەدەرگای کەنتۆری منداڵان بێنە دەرەوەو منداڵان بترسێنن یەکێك لەودێوانەش دێوێکی سەوزە ناوی (سۆلیڤانە) لەگەڵ دێوە بچووکە یەك چاوەکە کەکاری دێوەکان ئەوەیە کە منداڵان بترسێنن و منداڵەکانیش لەترساندا هاوار دەکەن و دەقیژێنن و شاری دێوەکان سوود لە قیژە و ترسی منداڵان وەردەگرن تاوەکو ووزە بەکاربێنن بەڵام لەیەکێك لەجارەکان "ڕاندل کە مارمێلکەیەکی چوار دەستە دەیەوێت منداڵان بەشێوەیەکی ناشرین بترسێنێت و لە یەکێك لەجارەکان منداڵێکی بچووك دێتە ناو دنیای دێوەکان و دەبێتە هاوڕێی "سۆلیڤان" بەڵام "ڕاندل" دەیەوێت کچە منداڵە بچووکەکە بکوژێت. سۆلیڤان و هاوڕێکەی یارمەتی دەدەن و دێوە خراپەکان لەناودەبەن و سۆلیڤان بیر لەوە دەکاتەوە لەبری ترساندنی منداڵان، دەڵێت کە ئیتر بۆ ووزەی شاری دێوەکان سوود لە پێکەنینی منداڵان وەرنەگیرێت، لەبەرئەوە هەموو دێوەکان ئیتر کە دەچنە نێو ژووری منداڵان بۆ ترساندنیان نەبێت بەڵکو بۆ پێکەنین وخۆشیان بێت. ئەم فیلمە بەرهەمی کۆمپانیای واڵت دزنییە و لە دەرهێنانی "پیتە دۆکتیر" و دەنگی دێوەکانیش دەنگی ئەکتەران "جون گودمان و بیللی کرستیلە".



# زنجیره فیلم کارتۆنی "گرین دایزەر"

کێ هەیە لەنێوەی منداڵان یان گەورەکان زنجیرە فیلم کارتۆنی " گرین دایزەری" نەبینیبێت، فیلم کارتۆنێکی زۆر زۆرخۆشە کە چۆن، دایزەرکوڕێکی ئازایە و لە ڕێگەی فڕۆکەکەیەوە لەئەستێرەی فیلید هاتووە و بەیارمەتی هاوڕێکانی زەوی لە دڕەندەو خراپەکارەکان رزگار دەکات و لەکۆتایشدا لەگەڵ خوشکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەستێرەکەی خۆی. ئەم فیلمە فیلم کارتۆنێکی یابانییەو لەبەرهەمی یابانە چیرۆکی ئەم فیلمە لە نووسینی "گۆناگی" دروست کردنی وێنەکان "ماسیوکی ئەکیهی"یە، ئەم فیلم کارتۆنە ساڵی ١٩٧٢بەرهەم هاتووە کە یەکەمین زنجیرە کارۆتن بوو باس لەڕۆبۆتەکان و مرۆڤە زەبەلاحە ئامێرەکان بکات کە شتێکی تازە بوو بۆ فیلمی وێنە کارتۆنیەکان، ئەم فیلم کارتۆنیە لەجۆری فیلمی "ئینمی یابانییە" کە چەندین وێنەکێشی بەتوانای یابانی وێنەکانیان کێشاوە، گرین دایزەر زۆر ئازا بووەو توانی زەوی لەخراپەکاران رزگار بکات کەلەئەستێرە دوورەکانەوە دێن بۆئەوەی زەوی وێران بکەن بەڵام "داسکی" کەناوی "گرین دایزەرە" لەگەڵ کوجی و هیکارۆ و ماری و بەیارمەتی دکتۆر مەئمون و تیمەکەی ڕووبەڕووی خراپەکاران دەبنەوە و ئەستێرەی زەوی دوور دەخەنەوە لەوێران بوون و شێواندنی.





# هەیڤەکان

**ئامادەکردنی: هەوار شەریف**

لەنێو کۆمەڵەی خۆردا زیاتر لە سەد مانگ هەیە، کە بەدەووری حەوت ئەستێرەدا دەسوڕێنەوە.
ئەستێرەی عەتارد و زوهرە هیچ مانگییان نییە. بچووکترین مانگیش بەقەبارەی شارێکی بچووکە.
پێش سی ساڵ تەنها سی و سێ مانگ دۆزرابۆیەوە.
پاش ئەوە مانگەکـــانی تر دۆزرایەوە، ئەویش بەهۆی دووربینە گـەردوونییەکانەوە کـــەبەتلسکۆب ناودەبرێت، مانگەکانی تر دۆزرانەوە و ئەو تلسکۆبانەش بەردەوام لەپێشکەوتندان.
زۆرترین مانگ بەدەوری هەسـارەی موشتەریدا دەسوڕێتەوە. زاناکـــان بە پەنجا مانگ دەستنیشانیان کـــردووە و گەورەترین مانگی مانگی ئەم هەسارەیە ناوی (جانمید)ە.
ئەمیش گەورەترین مانگە لەچاو گشت مانگەکانی هەسارەکانی تردا، کـە پانی دەگـــاتە ٥٢٦٥کم واتە گەورەترە لە هەسارەی عەتارد و بلۆتۆ.
هەروەها سی ئەستێرە بەدەوری هەسارەی زوحەلیش دا دەسوڕێتەوە. یەکەمین مانگ جگە لەمانگی هەسارەی زەوی کەدۆزرابێتەوە مانگەکـانی هەسارەکـــانی موشتەری و زوحەلن، کەلەسەدەی حەڤدەدا دۆزراونەتەوە، لەلایەن زانای ئیتاڵی (جیوفانی کاسینی)یە.
هەرمانگێکیش پێك هاتووە لە پێکهاتەیەکی بەردین یان پێکهاتەیەکی بەردینی بەستووو.







# گیاندارە لەنێوچووەکان

پێش ملیۆنان ساڵ گیانداری جۆربەجۆر لەسەر زەوی ژیاوون و لەنێوچوون.
لەو گیاندارانەش (دایناسورەکان و باڵندە دایناسورەکان و فیلی ماموس).
ئەو هۆکارانەی کە لە ئێستادا دەبێتە هۆی لەناوچوونی گیاندارەکان، تێکدانی کەشی ژیانی ئەو گیاندارەیە.
هەروا بڕینەوە و سوتاندنی دارستانەکان یان راوکردن یان کوشتنی گیاندارەکانە.
دایناسورەکانیش لەجۆری خشۆکەکان بوون و ملیۆنان ساڵ لەمەوپێش لەسەر زەوی ژیاوون و جۆری جیاوازیان بووە.
بەهۆی کەوتنە خوارەوەی موشەکێ بۆ سەر زەوی ئەو گیاندارانە لەنێوچوون.
باڵندەی دایناسورەکانیش وەك دایناسورن و سەد و پەنجا ساڵ پێش ئێستا ژیاون، شێوەی وەك دایناسورە و وەك باڵندەیەو پەڕی پێوە بووە.
ماموسیش جۆرێکی فیلە و کەلەنێو چووە. پێش دەیان هەزار ساڵ بەهۆی گۆڕانی کەش و هەوا لەنێو چووە، کەلە کیشوەری بەستووی باکوور و لە کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەوروپا ژیاوە. درێژی گەیشتۆتە سێ مەتر و گیانی بەفەروو داپۆشراوە دوو شاخی درێژی هەبووە.



# ئەنفلەوەنزای بەراز

ئامادەکردنی: پەسار

لە مانگی نیسانی ئەمساڵدا هەواڵی بڵاوبوونەوەی پەتایەکی نوێ بڵاوبووە بەناوی (ئەنفلەوەنزای بەراز).
سەرەتا ئەم پەتایە لە وڵاتانی مەکسیك و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاوبووە و دواتر بۆ وڵاتانی تری جیهان تەشەنەی کرد.
ئەمەش بووە هۆی نیگەرانی بۆ رێکخراوی تەندروستی جیهانی و رێوشوێنی توندیانگرتەبەر بەمەبەستی رێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایە.
ئەم ڤایرۆسە لە کۆمەڵەی ئەنفلەوەنزای A یە و لە رێگەی هەڵمژینی هەوا، بەتایبەتی لە وەرزەکانی پایز و زستاندا بڵاودەبێتەوە.
ئەم پەتایە بریتیە لە تێکەڵەی ئەنفلەوەنزای مرۆڤ و ئەنفلەوەنزای باڵندە و ئەنفلەوەنزای بەرازە بە ڤایرۆسی 1N1H.
مێژووی سەرهەڵدانی ئەم ڤایرۆسە دەگەرێتەوە بۆ ساڵانی ١٩١٨و ١٩٢٠دوای جەنگی جیهانی یەکەم کە سەرەتا لە ولاتی ئیسپانیادا سەری هەڵدا و بووە هۆی مردنی ٢٠تا ١٠٠ملیۆن کەس.

مرۆڤ چۆن تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبێت

لە راستیدا مرۆڤ راستەوخۆ تووشی ئەم ڤایرۆسە نابێت، بەڵکو لەرێگەی ئەو مرۆڤانە دەگواسترێتەوە کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بە بەرازەوە هەیە (واتە بەراز بەخێودەکەن). ئەم ڤایرۆسەش بەهەمان رێگەی ئەنفلەوەنزای ئاسایی مرۆڤ بڵاودەبێتەوە. ئەویش لە رێگەی پژمین و کۆکین کەسی تووشبوو یان کەسێکی ساغ دەست لەو شوێنانە دەدات کە دووچاری ئەم ڤایرۆسە بوونەتەوە و دواتر دەست لە لووت و دەمی خۆی دەدات.

ئەنفلەوەنزای بەراز بە دوو رێگە بۆ مرۆڤ دەگواسترێتەوە

یەکەم: ئەو مرۆڤانەی بەراز بەخێودەکەن و بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەستی لێدەدەن یان لەو شوێنانە دەژین کەوا بەرازی لێ بەخێودەکرێت.
دووەم: گواستنەوەی ئەم ڤایرۆسە لەرێگەی ئەو کەسانەی تووش بەم ڤایرۆسە بوون.



**ڕێگەکانی بڵاوبوونەوەی ئەنفلەوەنزای بەراز**

- لە بەراز بۆ بەرازێکی تر دەگواسترێتەوە.
- لە بەرازێکی تووشبوو دەگواسترێتەوە بۆ ئەو مرۆڤانەی ڕاستەوخۆ بەراز بەخێودەکەن.
- لە مرۆڤێکی تووشبوو بۆ مرۆڤێکی تر دەگواسترێتەوە.

**نیشانەکانی تووشبوون بەم پەتاییە**

نیشانەکانی ئەنفلەوەنزای بەراز، هەمان نیشانەی ئەنفلەوەنزای ئاسایی مرۆڤە. ئەویش بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و کۆکین و سەرئێشەوە و ئیلتهابی گەروو و لووت دەست پێدەکات و هەروەها جەستەی ئازاری دەبێت و بێهۆش دەبێت.

لە منداڵانی بچووکیش ئەم نیشانانە دەردەکەوێت: هەناسەدان بەشێوەیەکی نائاسایی، ڕەنگ زەربوون وو زوو تووڕەبوون.

**چۆنیەتی خۆ پاراستن لە تووشبوون لەم پەتایە**

- هەموو ڕۆژێ دەستەکان بە ئاو و سابوون بشۆرێ، بەتایبەتی لەکاتی نزیك کەوتنەوە لە ئاژەڵ یان دەستیان لێبدەیت.
- نزیك نەبوونەوە لەو کەسانەی تووش بەم ڤایرۆسە بوون.
- بەکارهێنانی پارچە پەرۆك یان کلینکس لە کاتی پژمین یان کۆکین.
- لە کاتێکدا دەستتەکانتان پیسن، دەست لە لووت و دەمتان مەدەن.
- پێویستە بەزووترین کات ئەو کەسەی نیشانەکانی ئەنفلەوەنزای بەرازیان لێ دەردەکەوێت بگواسترێنەوە بۆ نەخۆشخانە و بخرێنە ژێر چاودێرێکی چڕی پزیشکیی، بەمەبەستی چارەسەرکردنیان و هەروەها بەکارهێنانی کەمامە بۆ ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە لە کاتی پژمین یان کۆکینی کەسی تووشبوو.



# ژیاننامەی یاریزانی جیهانی ڕۆناڵدۆ

**ئامادەکردنی: مشکە**

ناسنامەی کەسایەتی یاریزان ڕۆناڵدۆ
ناوی تەواوی: ڕۆناڵدۆ لویس نازاریۆ دی لیما.
مێژووی لە دایك بوون: ١٩٧٦/١١/٢٢
شوێنی لە دایك بوون: شاری ریۆدی جانیرۆ-گەڕەکی بینیتۆ ریبریۆ لە وڵاتی بەڕازیل.
درێژی: ١،٨٢مەتر
شوێنی یاریکردن: هێرشبەر
ئەو یانەی ئێستا یاری بۆ دەکات: کۆرنسیانزی بەڕازیلی
ژمارەی درێس: ٩






دەستکەوتەکانی رۆنالدۆ

باشترین یاریزانی جیهان بەپێی ریزبەندی فیفا لە ساڵەکانی ١٩٩٦، ١٩٩٧، ٢٠٠٢.

باشترین یاریزان لە کیشوەری ئەوروپا و بەدەستهێنانی تۆپی زێرین لە ساڵەکانی١٩٩٧ و ٢٠٠٢.

باشترین یاریزانی جیهان بەپێی ریزبەندی رۆژنامەی (جیهانی تۆپی پێ) لە ساڵەکانی ١٩٩٦،١٩٩٧ ، ٢٠٠٢.

باشترین یاریزانی جیهان بەپێی ریزبەندی رۆژنامەی (ئۆنزێ) لە ساڵەکانی ١٩٩٦، ١٩٩٧،٢٠٠٢.

باشترین گۆڵکاری جامی جیهانی بە پانزە گۆڵ لە نۆزدە یاری.

گۆڵکاری جامی جیهانی ٢٠٠٢بە هەشت گۆڵ.

باشترین گۆڵکارە لە جیهاندا بەپێی ریزبەندی یەکێتی جیهانی بۆ مێژوو و ئاماری تۆپی پێ لە ساڵی١٩٩٧.

باشترین گۆڵکار لە کیشوەری ئەوروپا و بەدەستهێنانی (پێڵاوی زێرین) لە ساڵی ١٩٩٧.

بەدەستهێنانی نازناوی کەسایەتی وەرزشی لەلایەن کەناڵی **BBC** لە ساڵی ١٩٩٧.

نازناوی پاڵەوانی پاڵەوانان لە خولی ئیتاڵی بۆ ماوەی دە ساڵ ١٩٩٨-٢٠٠٨

ئەو یانانەی یاری بۆ کردوون

یانەی ئیندهۆڤنی هۆڵەندی

یانەی برشلۆنەی ئیسپانی

یانەی ئەنتەر میلانی ئیتاڵی

یانەی ریال مەدریدی ئیسپانی

یانەی ئەی سی میلانی ئیتاڵی

یانەی کۆرنسیانزی بەرازیلی



# مشکە و خوێنەرانی

ئامادەکردنی : شنە سەدیق



**ئەمکاتەتان باش هاوڕێکانم!**

هاوڕێیان دوێنێ نیوەڕۆ دوای ئەوەی کە نانی نیوەڕۆم خوارد، ئینجا چووم سەر خەوێکم شکاند. نەك سەر خەوێك! تێر و پڕ خەوتم تا دنیا بەتەواوی فێنکی کرد. ئەو کات هەستام و ویستم بڕۆم هاوڕێیەکی تر بناسم و بە ئێوەی بناسێنم.
ڕۆیشتم، هەر ڕۆیشتم، تا چوومە کۆڵانێکەوە. بینینم کۆمەڵە مندالێ پێکەوە یارییان دەکرد.
یەکێك یاری بە پاسکیل دەکرد، دوانیان یارییان بە تۆپێك دەکرد و کۆمەڵێك یاری ماڵە باجێنەیان دەکرد.
راستان پێ بڵێم حەزم لە هەموو یاریەکان دەکرد. بەڵام تۆزێك برسی بووم، چونکە تازە لە خەو هەستابووم حەزم لە خواردن دەکرد. بۆیە بڕیارم دا بڕۆم بۆلای ئەو کۆمەڵەی کە ماڵە باجێنەیان دەکرد، چونکە ئەوان خواردنیان دانابوو.
کە چوومە لایان یەکسەر منیان ناسییەوە.



بەڵام من ئەوانم نەدەناسی. لەگـەڵ یەکێك لەو هاوڕێیانە کـەوتینە گفتوگۆ
و یەکـتر ناسین ئەو هاوڕێیەی کـە حەزی دەکرد ببێتە هاوڕێی منیش و ئێوەش، کچێکی ئێسك سوك بوو نـاوی (سـۆزی) بوو. سـۆزی وتی من تەمەنم یازدە سـاڵەو ناوم (سۆزی کامەران)ە لەگــەڵ دایکم و باوکـم و خوشك و براکانمدا دەژیم.
من برایەکی لە خۆم بچووکترم هەیە. سۆزی دیاربوو کچێکی ژیر بوو چونکە ئەو دەیگوت لـەبەر ئەوەی براکـــەم لەخۆم بچووکترە، لە زۆر کاتدا بەقسەی ئەو دەکەم و داخوازییەکانی جێبەجێ دەکەم و ناهێڵم بگـری. ڕۆژێکـیان مۆتام کــڕی کەچی براکەم وتی هەر دەبێت بیدەی بەمن. مۆتاکەم دایەو قسەشم نەکرد! وتم با نەگری.
کـە من چوومە لای سۆزی جلەکـانی ڕەنگی سوور بوو. پێم وت حەزت لە چ ڕەنگێکـە؟ وتی: حەزم لە ڕەنگــی سوور و زەردە. وتم: حەزت لە چ میوەیەکە؟ وتی: حەزم لە پرتەقاڵ و لالەنگییە.
لە خواردنا حەزی لە برنج و فاسۆلیایە. سۆزی وتی: ڕۆژێکــیان چووم بۆ ماڵی پورم بــامیێیان لێنابوو، منیش برسیم بوو بۆیە ویستم بامیێکە بەدەست بخۆم.
دەستم سوتا وەکو بالە خەوانم لێهات. ئەوەت بیستوە کە دەڵێن: بالە خەوان تەمەڵە پشیلەی سەر مەنجەڵە...
سۆزی وتی: زۆر حەزدەکەم لەگەڵ پڵنگ ڕەسم بگرم.
سۆزی وتیشی حەزم دەکرد ناوم شووشە بوایە.
بەیەك شت زۆر دڵگرانبوو، بەوەی دەیوت ئێمە بەتەمایین بڕۆین بۆ دەرەوەی وڵات من حەزناکەم قەت کـوردستان و هاوڕێکانم بەجێبێڵم. ئەمەم پێ ناخۆشە.
منیش تۆزێك دڵنەواییم دایەوەو تۆزێك ختوکەم دا، تا تۆزێك پێکەنی و ئینجا وتم: ئەی لەوانەکانتدا چۆنی؟
ئەویش وتی: هەر زۆر زۆر باشم و حەزم لەوانەی بیرکارییە و زۆر جار خەوی پێوە دەبینم.
لە خەوما مامۆستای بیرکاریم. هەوڵیش دەدەم و حەزیش دەکەم ببم بە مامۆستای بیرکاری.
سۆزی دەیوت من لەگەڵ هاوڕێیەکمدا قسە ناکەم، بەعزم. زۆرم پێناخۆشبوو کە وای وت. وتم بۆ؟
وتی لەبەر ئەوەی لەخۆی باییە.
وتم: لەخۆی بایی یاعنی چی؟
وتی: یانی خۆی بە زل دەزانێ دەڵێ من لـە ئێوە جوانترم و من لــە ئێوە جلی بـاشترم هەیە و ئەم قسانە، بۆیە قسەی لەگەڵ ناکەم.
پێم ناخۆشبوو هاوڕێیەکی وای هەیە. بەڵام من پێم وت تۆ بڕۆ ئاشت بەرەوە لەگــەڵی و لەوانەیە ئەو هاوڕێیەت نەزانێ کارێکی هەڵەی کردووە تێی بگەیەنە کە ئەو کارەی ئەو هەڵەیەو نابێ وابێت.
سۆزی بەڵێنی پێدام کەبچێت بۆلای و لەگەڵیدا ئاشت بێتەوە.
هاوڕێکانم بێ ئێوە ناخۆش کە لە قەسەکانمان تەواو بووین، منداڵەکان وتیان دەبێ یاری ماڵە باجێنەمان لەگــەڵدا بکەی و نابێ بڕۆی.
وەڵا بێ ئێوە ناخۆش یارییەکی خۆشمان کرد و سفرەمان ڕاخست خواردنەکانمان دانا.
تێرمان خوارد و ئینجا من وتم: دەبێت بڕۆم ڕۆژێکی خۆش بوو.
سۆزی وتی خواحافیز مشکە گیان سەلام لە هەموو هاوڕێکان دەکەم. بای... بای...



# مۆزارت و ڤیڤالدی

نووسینی: ڕۆدان فەرهاد پیربالْ

پیاوی بەناوبانگ مۆزارت
فێری کەمان و پیانۆ
کە فێری دەبی پیانۆ
هەست دەکەیت کە مۆزارتی تۆ
کە فێری کەمان دەبیت
هەست دەکەیت کە ڤیڤالْدیت
ڤیڤالْدیش هەر زۆر زانە
ئەویش هەر پیانۆ زانە



# وەرزش و یاری

نووسینی: شەماڵ دیلان
سکێچ: شێروان موحسین




هەڤاڵان وەرزش خۆشە
تەوژمی بیروهۆشە
کاتێ دەچینە یاری
لەگەڵ هاوڕێم دیاری
دەبێ زۆر زۆر هێمن بین
زۆر بەخۆش بەختی بژین
کە یاری کۆتایی هات
نابێ بەفیڕۆ دەین کات
پاش وەرزش و یاری خۆش
دەخوێنین زۆر زۆر بەهۆش
سەرکەوتن بەدەست دێنین
کات بەفیڕۆ ناڕوێنین



# مشکە

# مشکە سەردانی لەندەن دەکات

نووسینی: ڕێواس ئەحمەد

دمبۆ و مشکە بڕیاریاندا پاش پاریس سەردانی لەندەن بکەن.
مشکە ئەمەی زۆر پێخۆش بوو، تا ئەو تۆزە ئینگلیزییەی کە دەیزانێ لەوێ بەکاری بهێنێ.
لەندەنیش وەك پایتەختی بەریتانیا شارێکی گەورەو ناودارە. دمبۆ هەندێك زانیاری گشتی بۆ مشکە ئامادەکردبوو.
لەندەن شارێکی دێرینە و پێش زایین ئەم شارە هەبووە. ئەم شارە لە کۆندا ناوی لۆندینیۆم بووە.
کاتێ ڕۆمەکان لە ساڵی شەست و یەکی زایینیدا سەر لەنوێ بنیاتیان نایەوە، ئیتر وردە وردە ناوەکەشی گۆڕا بۆ لەندەن.





لەندەن شارێکی پڕ خەڵکە و نزیکەی 7،4 ملیۆنی تێدا دەژی و ڕۆژانە زیاتر لە یانزە ملیۆن کەسێ تێدایە.
وەك بنکەی بازرگانی و کڕین و فرۆشتن دادەنرێ. لەندەن بە شەقامی ئۆکسفۆرد بەناوبانگە کە دوکانە ناودارو گەورەکانی لێیە.

هەروا پیکادیلی سیرکۆس یەکێکە لەو شوێنەدیارانەی کە خەڵکێکی زۆر ڕووی تێدەکەن.

پردەکانی لەندەن گەلێ جوانن زۆربەیان لەکۆنەوە دروستکراون.

پردی تاوەر پێش سەد ساڵ دروست کراوە.

ئەم پردانە هەردوو بەشی لەندەن بەیەك دەگەیەنن کە بەهۆی ڕووباری تێمسنەوە کراوە بە دوو بەشەوە.

مشکە بەیانی زوو لەخەو هەستا.

لە پەنجەرەی هوتێلەکەوە سەیری خوارەوەی دەکرد. لەناکاوا هاواری کرد.

- دمبۆ هەستە! ئەوە چییە شارە مێرووڵەیە! ئەم خەڵکە لە کوێوە هاتوون، خۆ نەباریوون؟

- مشکە پەلە مەکە هێشتا لە کوێمانە. گەر بچینە میترۆکانەوە چی دەڵێت. دەتەوێ بۆ کوێت ببەم؟

- با بچین بۆ لای سەعاتەکە. بیگ بێنی پێدەڵێن وانییە؟

- دەزانێ ئەو شوێنە پێی دەوترێ ماڵی پەرلەمان، کە پێش سەد و پەنجا ساڵی بنیادنراوەو دوو منارەی هەیە. منارە بەرزەکەیان پێی دەوترێ ڤیکتۆریا تاوەرەکە سەد و پەنجا مەتر بەرزە.

لە کاتێکدا پەرلەمان لەوێ کۆببێتەوە ئەوا ئالای بەریتانیی لەسەر دەشەکێتەوە.

منارەی تر کە پێی دەوترێ کلۆك تاوەر و نەوەد و پێنج مەتر بەرزە و کە بیگ بێنی لەسەر دانراوە.

ئەو سەعاتە قورساییەکەی 13،5 تەن دەبێت.

- دمبۆ سەیری ئەو پاسانەکە چەند جوانن، دوو قاتن! ئەوە چییە شوفێرەکە لای ڕاستەوە دانیشتووە! دەبێت لە کوێ ئەم جۆرە پاسانە دروست بکەن؟

- لێرە زۆربەی پاسەکان دوو قاتن تا جێگەی خەڵکێکی زۆری تێدا بێتەوە.

لەندەن و هیندستان یەکێکن لەو وڵاتانەی کە سیستەمی لێخوڕینی ڕاستیان هەیە.

- وەڵا من هەرگیز ناتوانم لە ڕاستەوە لێبخوڕم.

- بۆ لە چەپەوە دەتوانی لێخوڕی؟

- نا من نازانم لێخورم. خۆ من هێشتا نەبوومەتە هەژدە ساڵ.

- خێرا دەچین نانی بەیانی دەخۆین و دەست دەکەین بە گەڕان لێرە جگە لە دوکان و شەقام و پارکە گەورەکانی، مۆزەخانەی زۆر خۆشی تێدایە. بۆ هەندێکی دەچین.



# کتێبخانەی مشکە

ئامادەکردنی: مشکە
سکێچ: شێروان موحسین
ڕەنگ: گەیلان عەبدوڵڵا



لە کتێبخانەی مشکە هەر جارە و باسی کتێبێکتان بۆ دەکەین، بۆ ئەوەی ئێوەش بتوانن، ئەو کتێبەتان دەست بکەوێت و بیخوێننەوە.

**ناوی کتێب: کاتێك شێرۆ دەبێتە باڵندە**
**نووسینی: زانا ڕەئوف**
**وێنەکێشانی: گرفتار کاکەیی**
**بابەت: کۆ چیرۆکی منداڵان**



منداڵە خۆشەویستەکان ئەمجارە کتێبخانەی مشکە کتێبێکی بۆ ئامادە کردوون بەناوی (کاتێك شێرۆ دەبێتە باڵندە). کە ئەم کتێبە کۆمەڵە چیرۆکێکی نایاب لەخۆ دەگرێت کە ئەمەش ناونیشانی چیرۆکەکانە.
(ماسییە بچووکەکە، هاوکاریی، کاتێك شێرۆ دەبێتە باڵندە، ئاکامی لەخۆباییبوون، پەپوولەکە، خەونەکەی زانا، مەزنترین خۆشەویستی، تۆپی گەورە و تۆپی بچووك، ڕێزی شێر لە چییدایە؟!، کارە دزێوەکانی پۆشیا، پێکەوە ژیان)ە.
کتێبە قەبارە مام ناوەندییە و لە چاپ و بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری چاپ کراوە .



# گەلەریی مشکە






یارا محەمەد
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
قوتابخانەی یازدەی ئاداری تێکەڵاو




عەبدوڵڵا محەمەد
پۆلی سێیەمی سەرەتایی
قوتابخانەی یازدەی ئاداری تێکەڵاو




خالیدە عەبدوڵڵا
پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی شانەدەری تێکەڵاو




عەلی عەبدوڵڵا
پۆلی یەکەمی ناوەندی
قوتابخانەی وەلی دێوانەی کوڕان



# پێشەوەی مشکە

مندالآنی ئازیز وەرن با بەیەکەوە ئەم وێنەیە
بە چەند قۆناغێك دروست بکەین و لەپاشان
بەو شێوەی کە ئامادە کراوە رەنگی بکەین.



1



2



3



4



# ئەڵوەنی خانەقی

نووسینی: مەرسوم گەشبین

ڕووبارەکەی ئەم شارە
ئاوەکەی بەرەو خوارە
بەناو دار ودەشت و دۆڵ
بەسەر چەو و بەرد و خۆڵا
بەکناری چەم و چڕا
بەپێچاو پێچ و خڕا
بێ وچان هەر ناوەستێ
شار بە شار و دێ بە دێ
ئێژێ خۆم دەناسێنم
تۆوی شادی دەچێنم
ئاوێکی ڕوون و شینم
سووك و خۆ و شیرینم
ڕووبارێکی کوردانم
برای ئاوی سیروانم
ناوەکەم سا ئەڵوەنە
ماڵمان لە دۆڵ و کەنە

